# تۆپی پێ: وەرزشی خەڵک؟



مایکڵ ڕابرتز

وەرگێڕانی

کەیوان نوری

Football: a people's sport?

Michael Robert



هەفتەی ڕابردوو هەندێک لە یانە گەورەکانی ئەورپا ڕایانگەیاند کە دەیانەوێت لە نێوان خۆیاندا خولێکی نایاب(سۆپەر لیگ)دروست بکەن. ئەم بابەتە چەند ڕۆژێک سەردێڕی هەواڵەکان بوو وە ڕووبەڕووی ناڕەزایەتی فراوان بویەوەوە، لە کۆتایدا بێ ئەنجام بوو. شکستی هەوڵەکان بۆ دروستکردنی خولێکی نایاب لە یانە گەورەکانی تۆپی پێی ئەوروپا، لە لایەن ملیاردێرەکانی خاوەنی یانە گەورەکان، تەنها وەرزێکی دوور و درێژە لە چیرۆکی بەکاڵایبوونی وەرزش و گۆڕینی وەرزش بە دامەزراوەیەکی سەرمایەداری قازانج هێنەرە لەژێر سایەی خاوەندارێتی و کۆنترۆڵی سەرمایەدا.

بەڕێکەوت نیە کە جیپی *مۆرگان* بەڕێوەبەری سندوقی بەرنامەی (سۆپەرلیگ)ە، چونکە ئەوە بانکەکانن کە فۆرمی دەرەکی سەرمایەی جیهانین لە کۆنترۆڵکردنی وەرزشی مۆدێرندا. هەروەها شتێکی ڕێکەوت نیە کە بزوێنەر و هاندەری سەرەکی دروستکردنی خولە نوێیەکە بەڕێوەبەری ڕیاڵ مەدریدە، یانەیەک کە لە ڕابردوودا لەژێر هەژمونی سەڵتەنەتی گەندەڵی ئیسپانیا و فرانکۆنیزم، باڵی ڕاستی فاشیستی پایتەختی ئیسپانیا بووە. کۆنترۆڵی ڕیاڵ مەدرید بە پێچەوانەی زۆرینەی یانە گەورەکان لە لایەن یەک کەسەوەیە، ئەویش تەنها سەرمایەدارە گەورەکان دەتوانن ببنە بەڕێوەبەری، هەروەها یانەیەکە وەک زۆرینەی یانەکانی دیکە وابەستەیە بە مارکەسازی. جیا لەوانە ڕیاڵ مەدرید قەرزێکی گەورەی لەسەر کەڵەکە بووە .سۆپەرلیگ بڕیار بوو کارتێلێکی گەورەی قۆرغکاری بێ. و بە شێوەیەک پلانڕێژی بۆ کرابوو کە بە پارەی یانە بچوکترەکان و لە کۆتایشدا بە پارەی لایەنگران یان هەوادارانی تۆپی پێ کە زۆر زوو بڕیار بوو بە بڕە پارەیەک ئیشتراک بکەن تا لە ڕێگەی تەلەفزیۆنەوە تەماشای کێبڕکێکان بکەن یاخود بۆ بینینی یاریەکان لە یاریگادا ئامادەبن. بەڵام ئەم هەلومەرجە لە کاتی ئێستاشدا وەک خۆیەتی.

ناڕەزایەتی و هاتوهاوار لە دەوری ئەم کارتێلە ڕۆڵ و کارکردی سەرمایە لە وەرزشدا دەشارێتەوە. ئەمە هاوشێوەی کاتێکە کە ئابووریزانان لە بارەی ڕۆڵی خراپ و وێرانکەری قۆرغکاری قسەدەکەن، چونکە بە باوەڕی ئەوان سەرمایەداری کێبڕکێی گەلێک باش و دادپەروەرانەیە و تەنها دەبێت بە ئاراستەی (کێبڕکێی ئازاد) بگەڕێنەوە. واقیعیەت ئەوەیە کە وەرزش لە هەلومەرجی ئێستادا سەرمایە سەنتەرە و لە لایەن ملیاردێرەکانەوە کۆنترۆڵ و بەڕێوە دەبرێت؛ بە زۆری وەک شتێک کە پێی سەرگەرم ببن و لەگەڵ ئەوەشدا ڕۆژ بە ڕۆژ زیاتر دەبێتە پانتایەکی پارە خولقێن. هەوادارانی وەرزش هیچ دەنگێکیان نیە، یاریکەران و ڕاهێنەران ملکەچ و جێبەجێکاری فەرمانەکانن. هەندێک ڕێکخراو لایەنگری دژایەتیکردنی هەژمونی ملیاردێرەکانن بەسەر پانتای وەرزشدا، بەڵام بە گشتی ئەم ڕێکخراوانە پێشنیاری هیچ ڕێگە چارەیەک ناکەن جگە لەوەی کە بڵێن [لە ئێستادا ئێمە دەبێت کارێکی زیاتر لەوە ئەنجام بدەین کە باس لە دەرکردنی ئەو یانانە دەکات لە خولەکاندا یان لەبارەی فراوانبوونی خولی نایابی ئەوروپا لەگەڵ ئەواندا بگەینە ڕێکەوتن. کاری ئێمە ئەوەیە کە سەرلەنوێ یاساکان بنوسینەوە، دووبارە دەزگاکان بنیاتبنێینەوە و هەڵسەنگاندن بۆ ڕۆڵی خۆمان وەک هەوادار بکەینەوە].

کۆتایهاتنی ئەم کارتێلە هیچ لە واقیعیەتی بەکاڵابوونی وەرزش ناگۆڕێت. ئەوەی کە بەهای بەکارهێنانی وەرزش واتا (یاریکردن و تەماشاکردنی وەرزش) گۆڕدراوە بە بەهای ئاڵوگۆڕ و پارە بۆتە ئامانجی سەرەکی.

وەرزش هاوکات لەگەڵ سەرمایەداری پیشەسازیدا و لە سەرەتای سەدەی نۆزدەدا، گۆڕدرا بۆ پانتاییەکی چالاکی ئابووری و کاروکاسپی سەرمایەدارانە. تۆپی پێ لەبەرچاوبگرین: ٦٠٠ یاریکەری پیشەی لە پاڵەوانێتی باشترینەکانی ئینگلتەرا بوونیان

هەیە. نزیکەی ٤ هەزار یاریکەری پیشەی لە ئینگلتەرا و نزیک بە ٦٠ هەزار یاریکەری پیشەی لە سەرتاسەری جیهان. ئەڵبەت لە خوارەوە بۆ سەرەوە، نایەکسانی لە داهات و موچەی یاریکەرانی تۆپی پێدا زۆر گەورەیە: لە یاریکەرێکەوە کە هەفتەی ٥/١ ملیۆن یۆرۆی دەستدەکەوێت تا ئەوەی کە بە موچەی تۆپی پێ ناتوانێت بژی و دەبێت کاری دووەمی هەبێت (ئەگەرچی ئەم گروپەیان هێندە گەورە نیە). و ئەڵبەت کەسانێکیش هەن کە تەنها بۆ سەرگەرمی و کاتبەسەربردن یاری تۆپی پێ دەکەن. بە گریمانەی نزیک بە٢٥٠ ملیۆن یاریکەری تۆپی پێ لە دونیادا بوونیان هەیە.



نایەکسانی داهات لە یاری تۆپی پێدا هاوشێوەی وەرزشە گەورەکانی دیکەی جیهانە: بەیسباڵ و تۆپی پێی ئەمریکای، کریکێت و تێنس. خاڵێکی هاوبەشی تۆپی پێ و بەیسباڵی ئەمریکای ئەوەیە کە بڕیار بوو ئەوانە وەرزشی کۆی کۆمەڵگا بێت. بەڵام لە ڕاستیدا لە ئاستێکی دیاریکراودا هەرگیز وەرزشی خەڵکی یان کۆی کۆمەڵگا نەبوون. یەکەم ئەوەی کە ژنان تا ئەم ماوەیەی دوایش بە شێوەیەکی گشتی لە بواری وەرزشیدا پەراوێز خرابوون.

تۆپی پێ وەرزشی کۆی کۆمەڵگا نەبووە، کێبڕکێیەکی پیاوانە بووە کە تەنها پیاوان یاریکەر و بە گشتیش پیاوان تەماشاکەر بوون. ژنان هێندە وەرزش و بەتایبەت تۆپی پێیان نەدەکرد. تۆپی پێی ئافرەتان بە تازەی کەمێ لایەنگر و تەماشاکەری پەیدا کردووە و سەرمایە و هەوادارییش بۆ خۆی ڕاناکێشێت. بڕیار بوو کە ژنان لە ماڵەوە بمێننەوە و خواردن ئامادە بکەن بۆ ئەوکاتەی کە پیاوان لە یاریکردن یا تەماشاکردنی یاری دەگەڕێنەوە. لەبارەی کریکێتەوە چاوەڕوانی ئەوە لە ژنان دەکرا کە چای و ساندویچ دروست بکەن بۆ ئەو پیاوانەی لە یاریگادا سەرگەرمی یارکردن بوون.

نەژادپەرستی بە هەمان شێوە هێز و کاریگەری گەورەی هەبووە لە ناو وەرزشی بە مۆدێرنکراودا. ئەگەر تۆ کەسێکی ڕەشپێست یاخود ئاسیای بوویت ئەوا لە کێبڕکێ پیشەیەکاندا بە تەواوی پەراوێز دەخرایت. بۆ نمونە تا ساڵی ١٩٤٧ یانە پیشەیەکانی بەیسباڵی لە ئەمریکا ڕێگەیان بە یاریکردنی ڕەشپێیتەکان نەدەدا. بەیسباڵ تا ئەوکات نەک تەنها وەرزشێکی پیاوانە بەڵکو وەرزشی پیاوانی سپیپێس بوو. بە دیاریکراوی ئەو جێگەیەی کە پارەی لێبوو.

شوێنی لەدایکبوونی کریکێت گوندەکانی سەدەکانی ناوەڕاستی ئینگلترا و فەرەنسا بوو کە جوتیارانی گوند ئەم یاریەیان دەکرد. بەڵام زۆر زوو بوویە وەرزشێکی چینی باڵا و لە ئاستی باڵاکەشدا کەوتە ژێر هەژمونی چینی دارا و ئەریستۆکراتەکان (لە ئینگلتەرا تا ئێستاش بە هەمان شێوەیە). لە ئینگلتەرا کێبڕکێ پیشەییەکان لە نێوان یاریکەرانێک کە لە بەرامبەر یاریدا پارەیان وەردەگرت و جنتڵمانەکان (فیوداڵەکان)دا بووە کە هێندە پارەدار بوون پێویستیان بە پارە نەبووە. لە واقیعدا، لە دڵی کریکێتدا واتا یاریگای لۆرد Lords in England شوێنی هاتنە ژوورەوەی یاریکەران و جنتڵمانەکان لەیەکتر جودا بوون و وە هەر گروپێکیش کەساڵی دواتر یاری دەکرد ئەو نەریتەی ئەنجام دەدایەوە. شتێکی سروشتییە لە سەرمایەداری مۆدێرندا کە پارە قسە دەکات کۆی ئەم نەریتانە فڕێدراون.

ئەمڕۆ کریکێت گۆڕدراوە بە کۆمپانیایەکی سەرمایەداری جیهانی کە لە لایەن ملیاردێرە هیندیەکانەوە بەڕێوەدەبرێت و لە کێبڕکێ قازانجهێنەکانی خۆیاندا کەڵک لە یاریکەرانی پولەکی[1] کریکێتی سەرانسەری جیهان وەردەگرن. کریکێت لە باشووری ئاسیادا بوویە وەرزشێکی خەڵکی (بەرهەمی باڵادەستی ئیستیعماری) بەڵام لە ئاستە باڵاکەیدا بە تەواوی کاڵایی بوو. لە واقیعدا کارتیلی سوپەرلیگی تۆپی پێ هەر ئێستا لە کریکێتی هندستاندا چالاکی ئەنجامدەدات، ئەمە لەکاتێکدایە کە پاڵەوانێتیە ناپیشەییە کۆنەکان بەرامبەر بە هێرشی سەرمایەی ملیاردێرەکان خەریکە لەناودەچن. ئەمڕۆ لە قوتابخانە دەوڵەتیەکانی ئینگلتەرا هیچ کەسێکی وا یاری کریکێت ناکات، یاریکەرانی پیشەی یان لە قوتابخانە تایبەتەکانەوە دێن یاخود لە خێزانی کریکێتی. کرێکارانی یاریکەری ناوچەی پیشەسازی *یۆرکشایەر و لانکشیەر* تەقریبەن لەناوچوون.

[1] ئەو یاریزانانەی کە بەهۆی تەمەنەکەیان لە یانە گەورەکانی جیهان پەراوێز دەخرێن، دەرئەنجام بە دوای پارە دەکەون و دەچنە ئەم یانانە.

تێنس هیچکات وەرزشی خەڵکی نەبووە. ئەرستۆکراتەکانی سەدەکانی ناوەڕاست داهێنەری ئەم وەرزشە بوون کە لە کۆشکەکانیاندا و بۆ بەسەربردنی کات یاریان دەکرد. بەوهۆیەی کە وەرزشی چینە باڵاکان بووە پێگەی خۆی وەک چالاکیەکی پیشەی وەرزشی لە کۆتای سەدەی بیستدا بەدەست هێنا. پاڵەوانی کریکاری ئینگلیزی فرێد پیری Fred Perry منالی یەکێ لە خەیاتەکانی *لانکشایەر* کە سێ جار بوو بە پاڵەوانی *ویمبڵدۆن* و هەش جاریش گراند ئەسلامی بردۆتەوە، بەڵام بەرپرس و ڕێکخەرانی تێنس هەرگیز بە فەرمی دانیان پێدا نەنا چونکە دەیویست ببێتە پیشەگەر و لەو ڕێگەیەوە پارە پەیدا بکات. پیشەگەربوون کاتێ لە تێنسدا دروست بوو کە سەرمایەداری زانی کە دەکرێت تێنس ببێتە پانتاییەکی قازانجهێنەر. لە ئێستادا تێنسیش یەک دامەزراوەی بە جیهانیبووی دیکەیە کە لە لایەن سەرمایەدارە ملیاردێرەکانەوە بەڕێوەدەبرێت کە کێبڕکێی توندی پلەبەندی و داهاتی دروستکردووە.

بەوهۆکارەی کە ڕۆژانە ملیۆنها کەس پاسکیل لێدەخوڕن. ڕەنگە پاسکیل سواری بە وەرزشی خەڵکی بێتە هەژمار. بەڵام لە کاتێکدا کە ملیۆنها کەس لە هەموو کۆتای هەفتەیەکدا بۆ چێژوەرگرتن سەرگەرمی پاسکیل سوارین، لە ئاستی پیشەکاندا گۆڕدراوە بەیەکێکی دیکە لە بەرهەمە بازرگانیەکان کە لەلایەن ملیاردێرە مالیەکانەوە کۆنترۆڵ دەکرێت، کە پڕە لە بەکارهێنانی موادی هۆشبەر، گەندەڵی ئیدار و قوماربازی.

ڕەگبی لە هەر لە سەرەتاوە وەرزشی پلە باڵاکان بووە هەرچەندە کە لەگوندەکانی دەوروبەری کانەکانی ویڵز لایەنگرانێکی پەیداکرد (بە تەنها پیاوان). جگە لەوە ڕەگبی وەرزشی سەرەکی جوتیاران لە ناوچە دەوڵەمەندەکانی ئینگلترا، فەرەنسا و وڵاتانی ئیستعماری ئوسترالیا، نیوزلەند و ئەفریقای باشور و قوتابخانەی تایبەتی چینە باڵاکان بووە. خولی ڕەگبی لە باکووری ئینگلتەرا و لەو ناوچانەی کە چینی کرێکار تیایدا

نیشتەجێبوون گەشەی کرد و فۆرمی پیشەی خۆی وەرگرت تا یاریکەرانی چینی کرێکار بتوانن بیکەنە سەرچاوەیەکی داهات، شتێک کە بەرپرسانی یەکێتی ڕەگبی بە شتێکی خراپیان دەزانی. تەنزی ئەم ڕووداوە لەوێدایە کە سەرمایە لە کۆتایدا یەکێتی ڕەگبیشی Rugby Union بە پیشەی کرد و لە ئێستاشدا پارە لەوێدایە، ئەمە لە کاتێکدا کە خولی ڕەگبی Rugby League[2] بە بەراورد بەوە پارەیەکی ئەوتۆی تیادا نیە.

وەرزشی خەڵکی **بایسکیتبال** لە ئەمریکا، لە لایەن کۆچبەرانی ئینگلیزیەوە بۆ ئەم قاڕەیە بردرا کە یاریکەران یاری تۆپ و داریان دەکرد. بەڵام بە تەواوەتی (لە بەرامبەر دەستکەوتەکانی سۆپەر لیگ)دا بە بازرگانی کرا. یاری تۆپی پێ لە ئەمریکا هەرگیز وەرزشی چینی کرێکار نەبووە، و هاوشێوەی ڕەگبی لە ئینگلتەرا لە ئایۆ لیگی[3] دەوڵەمەندەکانەوە سەرچاوەی گرتبوو.

ئەمڕۆ منداڵانی چینی کرێکار کە توانا و بەهرەیەکی وەرزشیان هەیە هەوڵێکی زۆر دەدەن تا قەرزی تۆپی پێ، تێنس و بایسکیتباڵ وەربگرن ئەمەش وەک هەنگاوێک بۆ بەدەستهێنانی سامان لە پاڵەوانێتیە پیشەییەکاندا. ئەڵبەتە تەنها کەمینەیەکی زۆر بچوک بە بوونی فیداکاری گەورە و ماندووبونی لەڕادەبەدەر دەتوانن لەو کارەدا سەرکەوتوبن.

---

[2] یەکێتی ڕاگبی کە زیاتر ڕاگبی پێ دەوترێت جیاوازن لەگەڵ خولی ڕاگبی کە زیاتر خولی پێ دەوترێت. یەکەمیان ١٦ کەس و دووەمی ١٣ کەس یاری دەکەن.

[3] ئایۆ لیگ: کۆمەڵێک لە بەناوبانگترین زانکۆ تایبەتەکانی ئەمریکا

له حەقیقەتدا تۆپی پێ له ئەوروپا وەرزشێکی کرێکاری بوو. له سەرەتادا کرێکارانی گوند و دواتریش کرێکارانی شارە پیشەسازیەکان تۆپی پێیان دەکرد. و بە گشتی یان هیچ پارەیەکی تیادا نەبوو یاخود پارەیەکی زۆر کەمی تیادابوو .کرێکارانی پیاو (کەمێکیش کرێکارانی ژن) پێیەوە سەرقاڵ بوون. تۆپی پێ بۆ زۆر کەسی بە توانای چینی کرێکار ڕێگەیەک بوو بۆ دەربازبوون له هەژاری، بە هەمان جۆر کە یاری بۆکسێن ڕێگەیەکی دیکە بوو. بەڵام سەرمایەله نزیک بە ١٥٠ پێش ئێستاوە کۆنترۆڵی خستۆتە ژێر هەژموونی خۆیەوە. ئەمڕۆ تۆپی پێ کاروکاسپی یەکە کە ملیاردێرەکان جیا له قازانج کە بزوێنەری سەرەکیە، بۆ سەرگەرمی خۆیان سەرپەرشتی دەکەن و بەبەردەوامیش لە لایەن سەرمایەی جیهانیەوە خۆراک دەدرێت. یانەکانی تۆپی پێ پشکداریان هەیە و نرخی پشکەکانیان له ڕێگەی بازاڕی بۆرسەوە دیاری دەکرێت و هەر لەوێش کڕین و فرۆشی پێوە دەکرێت. هاتوهاواری سۆپەر لیگ تەنها کۆتا وەرز لە بە کاڵایکردنی وەرزشە لە ناو سیستەمی سەرمایەداریدا.

ئەمڕۆ وەرزش لە ئاستی سەرەوەیدا لەلایەن سەرمایە و لە پێناوی سەرمایەدا بەڕێوەدەبرێت. یاریکەرانی ئاستەکەی سەرەوە هاوشێوەی گلادیاتۆرەکانی ڕۆمای کۆن موچەیەکی چەور و گەورەیان هەیە( توێژی سەرەوەی یاریزانان) و بە ملیۆنان کەس لە دونیادا خۆشیان دەوێن. بەڵام لەبەر ئەو هۆکارەی کە وەرزش بە خاتری قازانج دەکرێت و بەڕێوەدەچێت ماوەی ژیانی وەرزشیان بە خێرای بەسەردەچێت. سەدان ملیۆن کەس لە جیهاندا وەک سەرگەرمیەک تەماشای ئەم گلادیاتۆرانە دەکەن، کەچی خۆیان کەمتر ئەم یارییە دەکەن.

ئەوەی چیرۆکی تۆپی پێ و وەرزشەکانی دیکە پێمان دەڵێت، ئەوەیە کە تۆپی پێ ناتوانێت لەژێر سایەی سیستەمی سەرمایەداریدا ببێتەوە بە وەرزشی خەڵکی. بۆ بە

خەڵکی بوونەوەی یاریگاکان و یانەکان دەبێت بکرێنەوە بە موڵکی گشتی وبەڕێوەبردنی یانەکان دەبێت لەسەر بنەمای یەک ئەندام و یەک دەنگ و لەلایەن ئەندامانەوە بێت. خەرجیەکانی وەرزش دەبێت لە لایەن دەوڵەتەوە دابین بکرێت نەک سەرمایە. یاریکەران دەبێت بەهەمان شێوەی کار و پیشەکانی دیکە بە موچەیەکی ئاشکرا و ئاسای دابمەزرێن. سەرمایەی تایبەتی و وەرزش لە پێناوی قازانج دەبێت کۆتای بێت و بە وەرزشێکی واقیعی کە وەرزشی خەڵکە شوێنی بگیرێتەوە، وەرزشێک کە لەلایەن خەڵکیەوە بەڕێوەدەبرێت و لە پێناوی خەڵکیدایە. بەواقیعی بوونی ئەم ئایدیایە بە تەنهای مومکین نیە و تەنها لە چوارچێوەی بەرنامەیەکی گشتگیری خاوەنداریێتی گشتی و کۆنترۆڵی دیموکراتی لە کۆمەڵگادا مومکینە .

